١

زنجیرەی چیرۆکی گیانلەبەران لە قورئانی پیرۆزدا

# مانگا سپاردراوەکە



(بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان)

ڕۆڵە شیرینەکانمان..

ئەم چیرۆکانە خوای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا بۆمانی دەگێڕێتەوە..

ئێمەش بەو ڕەنگ و نیگارانەوە پێشکەشتانی دەکەین.
تا دڵتان بە خۆشەویستی خواو قورئانە پیرۆزەکەی هەردەم گەشاوە بێت.

سوودو پەندی لێ وەرگرن لە ژیانتاندا.

**نووسینگەی تەفسیر**
**هەولێر**



زنجیرەی چیرۆکی گیانلەبەران لە قورئانی پیرۆزدا

١

# مانگا سپاردراوەکە



## مانگا سپاردراوەکە*

لەسەردەمەکانی پێشوودا پیاوچاکێك هەبوو، هەتا بڵێی لە خواترس و پارێزکاربوو، ژیانی دونیا فریو**ی نەدابوو، کۆکردنەوەی سامانی بەلاوە گرنگ نەبوو..

هەربۆیە تەنها خاوەنی مانگایەك بوو، هەموو ڕۆژێك دەیبردە لەوەڕگەو*** دەیلەوەڕاند، کاتێك زانی وا زۆر پیر بووەو بەساڵاچووەو وادەی مەرگی نزیك بۆتەوەو دەبێ ئەو ژیانە بەجێ بهێڵێ، دەستی نزای بەرزکردەوە بۆ پەروەردگارو بەکوڵ لە خوای گەورە پاڕایەوە: (خوایە گیان تەنها ئەم مانگایەم هەیە دەیدەمە دەست تۆ، تکام وایە بیپارێزی هەتا کوڕە تاقانەکەم گەورە دەبێت، تا سودی لێ ببینێ لە ژیانیدا)..

---

* سپاردراوەکە: بەئەمانەت دراو. ** فریو: هەڵخەڵەتاندن. *** لەوەڕگە: شوێنی لەوەڕاندنی مەڕو ماڵات.

ئیتر مامە پیرەی خواناس بەم هیواو ئاواتەوە ڕۆژانی دەگوزەراند، زێتر بە ڕووناکی خوای گەورە دڵ و دەروونی شاد دەبوو کە ئاواتەکەی بێنێتە جێ و، خوای گەورە مانگاکەی بپارێزێ بۆ کوڕە بچکۆلە تاقانەکەی..

مامە پیرە بەم هیوایەوە سەری نایەوەو مەرگ ڕێگەی پێ‌گرت، ماڵئاوایی لە دونیا کرد، پاشان کەس نەبوو مانگاکە بەخێوبکات و بیباتە لەوەڕگە، بۆیە هەروەك بڕیاری دابوو بەڕەڵا کرا، مانگاکە بێ‌گاوان مایەوە، دەسوڕایەوە بەدەشت و دەردا، بەبێ ئەوەی زیان بگەیەنێتە کێڵگەو بێستانی کەس، هەتاکو کوڕەی پیاوە خواناسەکە وردە وردە گەورە بوو، جا ئیتر زانی بەوەی باوکی مانگایەکی داوەتە دەست خوای گەورە،خوای گەورەش باشترین کەسە سپاردەی خەڵکی بپارێزێ، بە تایبەتی گەر پیاوێکی باش و چاکە کاربێت وەك مامە پیرەی باوکی، بۆیە ڕووی نزای کردە خوای گەورەو ووتی:



- ئەی خوای گەورە، پەروەردگاری ئیبراهیم و یەعقوب تکات لێ دەکەم ئەو سپاردەیەم بۆ بگێڕەرەوە کەکاتی خۆی باوکم پێی سپاردبووی.



پاشان کوڕەکە کەوتە گەڕان بەدەشت و مەزراکاندا، بە شوێن ئەمانەتەکەیدا، هەتا رۆژێکیان چاوی کەوت بە مانگایەك لێی نزیك بوەوەو دەڵێی ئەم مانگایە هەر لە کۆنەوە دەناسێ، ئینجا بۆی دەرکەوت ئەمە ئەو راسپاردەیە کە باوکی بەخوای گەورەی سپاردبوو. پاشان سوپاسی زۆری پەروەردگاری کردوو، کەوتە گرنگی پێدانی و بەخێوکردنی بە باشترین شێوە، مانگاکەش رەزیلی نەدەکرد لە بەخشینی شیرو ماستەکەی.



لەناو (بەنی ئیسرائیلەکاندا) پیاوێکی ئێجگار دەوڵەمەند هەبوو، خوای گەورە ماڵ و موڵکێکی زۆری پێبەخشی بوو، بەڵام لە منداڵدا تەنها کوڕێکی پێدا بوو. بۆیە بە مردنی ئەم کابرا دەوڵەمەندە هەرچی سەروەتی هەبوو بۆ ئەم کوڕە تاقانەی بەجێ دەما، جا کاتێك باوکی کوڕە مرد، چەند ئامۆزایەکی چاوی تەماع و چاوچنۆکیان تێبڕی و، ئەیان ویست

دەست بگرن بەسەر موڵك و سامانە زۆرەکەی مامیان دا،

واته : باوکی کوڕە تاقانەکە، ئیتر هەستان بەپیلان دانان بۆ
لەناوبردن و کوشتنی کوڕە بەستەزمانەکە.
ئەوەبوو ڕێکەوتن لە سەر کوشتنی و کوشتیان و



لاشەکەیان بە شەو بردە نزیك گوندێکی دراوسێی گوندەکەی خۆیان، بەمەبەستی تۆمەت بارکردنی خەڵکی ئەو گوندە، کە بێ ئاگابوون لەم تاوانە!! دەمەوبەیان خەڵکی ئاوایی بینیان وا لاشەی کوژراوێك لەتەنیشت گوندەکەیان کەوتووە.





هەر بە بڵاوبوونەوەی هەواڵەکە، خێرا ئامۆزاکانی تۆمەتەکەیان خستە پاڵ خەڵکی گوندەکە وەك بڕیاریان دابوو.

ووتیان: ئێوە کوڕی مامەکەمانتان کوشتووە. دیارە ئەمەش بە مەبەستی دورخستنەوەی تاوانەکە لە خۆیان بوو..

خەڵکی ئاواییەکە ووتیان: ئێمە نەمان کوشتووەو ئاگامان لێ نییە..

بەڵام ئامۆزاکانی هەر سووربوون لەسەر تۆمەتبارکردنیان .. بۆیە تا دەهات ئەم کێشەیە قوڵتروگەورەتر دەبوو. خەڵکی ئاواییەکە ناچار بوون کێشەکە بەرنە لای حەزرەتی موسا ـ دروودی خوای لەسەربێ ـ بۆ ئەوەی دادوەریان بۆ بکات و تاوانەکە ئاشکرا بکات. حەزرەتی موسا لە خوای گەورە پاڕایەوە کۆمەکی بکات



بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، پاشان ووتی بەخەڵکەکە بڕۆن مانگایەك سەربڕن و بیدەن لە زمانی کوژراوەکە، ئینجا زیندوو دەبێتەوەو بەزمانی خۆی دەڵێت کێ کوشتویەتی و تاوانەکەی ئەنجام داوە..

بەڵام ئەم هۆزە کاتێك گوێیان لەم داوایەو دادوەریەیی حەزرەتی موسا بوو، تووشی سەرسامی بوون، وایان زانی موسا گاڵتەیان پێدەکات و بەکەم عەقڵیان دادەنێ!!بۆیە دواتر گەڕانەوە بۆ لای حەزرەتی موساو ئەم گومانەیان کە پێ بردبوو پێیان ڕاگەیاند..

ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی : پەنا دەگرم بەخوا لە نەزانین، بەڵکو من خوای گەورە چی پێ ڕاگەیاندم ئەوەتان پێ دەڵێم.



بێگومان ئەگەر ئەو کاتە هەر مانگایەکیان سەرببڕیبایە، کارەکەیان سەری دەگرت، بەڵام ئەوەندە پرسیاریان کردو لەسەری ڕۆیشتن تا خوای گەورە گرانی کرد لەسەریان، بەشێوەیەك هەر چیان دەکرد مانگاکەیان بۆ نەدەناسرایەوە. ئەو نیشانانەی پێویست بوون بەئاسانی بەدیار نەدەکەوتن، ئیتر ئەمە جارێکی تر سەرسامی کردن و گەڕانەوە بۆ لای موسا پێغەمبەرو لێیان پرسی:- ئەو مانگایە چۆنە تۆ دەیڵێی؟! ئایا وڵاخەو ئێمە دەیبینین؟ یا خود گیانلەبەرێکی ترەو تایبەتمەندی خۆی هەیە؟!! حەزرەتی موسا .. وەڵامی دانەوە:- لە ڕاستیدا مانگەیەکی نەجوانەو نە پیرە، بەڵکو مام ناوەندییە، بڕۆن پەیدای بکەن . بەڵام هەروەك ڕەفتاری ئەو هۆزە وابوو، دیسان هاتنەوە لای حەزرەتی موسا داوایەکی تریان لێکردوو ووتیان:

-پرسیار بکە لە خوا، ئا خۆ ڕەنگی ئەو مانگایە چۆنە؟!*

*ئاماژەیە بۆ ئایەتی: (أدعُ لَنا رَبّكَ يُبَين لَنا ما لَونُها).

ئەویش داواکەی بەجێ هێنان و پێ ی ووتن:
-مانگایەکی زەردی تۆخی سەرنج راکێشە*
بەڵێ تا دەهات سەرسام تر دەبوون، لێیان دەشێوا، دەهاتنەوە لای حەزرەتی موساو دەیانووت:
-نیشانەی زیاترمان پێ بلێ لەسەر مانگاکە!!
داوایان دەکرد دۆعایان بۆ بکات، کەخوای گەورە یارمەتی و ڕێنمونیان بکات..
هەروەها حەزرەتی موساش بەردەوام نیشانی تری بۆ باس دەکردن سەبارەت بە مانگاکە پێ ی ووتن:
-ئەو مانگایە چ پێویستێکی بەلەوەڕاندن نی‌یەو، وەلە هەموو عەیب و عارێك بەدووره، رەنگێکی زەردی تۆخی هەیە بێ پەڵە..
ئیتر زۆر گەڕان هەتا مانگایەکیان دۆزیەوە، کە ئەو نیشانەو داواکاریانەی هەموو تیابوو، پرسیان کە خاوەنی کێ یە، بۆیان دەرکەوت هی لاوێکی بێ باوکە، دیارە ئەم لاوەش کوڕی کابرای خواناسە کە مانگاکەی سپارد بە خوای گەورە، خەڵکەکە هاتنە لای لاوەکەو داوایان لێکرد تامانگاکەیان پێ بفرۆشێت، بۆئەوەی سەری ببڕن و تاوانەکە ئاشکرا بێ، بەڵام کوڕە لاوەکە داواکەی قبوڵ نەکردو، لەدڵی خۆیدا ووتی: (چۆن ئەو دیاری‌یە بەنرخەی باوکم دەفرۆشم)!! بەڵام خەڵکەکە هەر زۆر سووربوون و پارەیەکی زۆریان پێدا، تاکوڕەکە رازی بوو، دیارە ویستی خوای گەورەش ئاوەهایە بۆ ئەوەی تاوانەکە ئاشکرابێ، کوڕە مانگاکەی بە پارەیەکی زۆر پێ فرۆشتن، ئیدی پارەی مانگاکە ئەوەندە زۆربوو بوویە خێرو بێر رژا بەسەر کوڕە هەژارە تاقانەکەدا، بەبۆنەی دیاری‌یە بەنرخەکەی بابی ..
خەڵکەکەش دیسان پاش بگرەو بەردەیەکی زۆر ئەوجا مانگاکەیان سەربڕی و، دایان لە زمانی کوڕە هەتیوە کوژراوەکەو هاتە قسەکردن هەروەك حەزرەتی موسا گفتی پێدابوون.
کوژراوەکەپێ ی ووتن: کوڕە مامەکانی خۆی( واتە : ئامۆزاکانی) تاوانەکەیان ئەنجام داوە، نەك خەڵکی گوندەکەی دراوسێیان، بەمەش تاوانباران سزای تاوانەکەیان وەرگرت، هەروەها کوڕە لاوەکەش بەبۆنەی دیاری‌یە بەنرخەکەی باوکی ومیهرەبانی خوای گەورەوە بە ژیانێکی خۆش وکامەران شادبوو..

**پشت بە خوا چاوەڕوانی زنجیرەی چیرۆکی ( پەپوو سلێمانە ) بن.**

---

* ئاماژەیە بۆ ئایەتی: (أنها بَقَرةٌ صَفراء فاقِعٌ لَونُها تَسُرُّ النَاظرِين).

# مانگا سپاردراوەکە



ئامادەو وەرگێڕانی : باوکی دادیار
سەرپەرشتی هونەری و نیگارکێشانی :
دڵشاد عەلی

ژمارەی سپاردن : ( ١٧٤ ) ساڵی ١٩٩٩ ز- ١٤٢٠ك
تیراژ : ( ٣٠٠٠ ) دانە
نرخی ( پێنج ) دینارە



نووسینگەی تەفسیر بۆ چاپکردن و بڵاوکردنەوە — هەولێر
بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین — هەولێر
هەرزی ڕەنگەکان : ژیار بۆ کۆمپیوتەر